# بەرنامەیەکی تۆکمە و بەهێز

## بۆ لەبەرکردن و دوبارەکردنەوەی

# قورئانی پیرۆز

نوسینی

إدريس محمود

------------------------------

لە بڵاوکراوەکانی ماڵپەڕی بەهەشت

ba8.org

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله وحده، والصلاة والسلام على مَن لا نبي بعده،

أمَّا بعد:

قورئان بەهاری دڵانە، ڕووناکی سنگەکانە، لابەری خەمەکانە، لە خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئاندا هەم دەرونت ئاسودە دەبێت لە دونیادا وە هەم لە دوارۆژیشدا پاداشتی گەورەت دەست دەکەوێت ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی :

" خيركم من تعلم القرآن وعلمه " (رواه البخاري) .

واتە : باشترینتان ئەوانەتانە کە خۆیان فێری قورئان دەبن و خەڵکیش فێر دەکەن .

قورئان دابەزێنراوە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە، لەبەری بکەیت، لێی تێبگەیت، کاری پێبکەیت، بانگەوازی

پێبکەیت، خۆت و ماڵت بکەیت بە قوربانی لە پێناویدا، نەك قورئان بخەیتە خزمەتی خۆت و بۆ پەیداکرنی ماڵ و سەروەت و سامان بەکاری بهێنیت .

ئەو کەسەی قورئانی لەبەرە و کاری پێکردوە لە دونیادا ئەو پێشەوایە لە نوێژدا و لە کەسە تایبەتەکانی خوای گەورەیە ، لە گۆڕیشدا قورئان ڕێگرە لەوەی سزا بدرێت ، لە قیامەتیشدا شەفاعەتی بۆ دەکات ، لە بەهەشتیشدا پلەی بەرز دەکاتەوە ، بۆیە حەق وایە هەموو کەسێکی موسڵمان گەورە و بچوك خوێندەوار و نەخوێندەوار هەوڵی لەبەرکردنی هەموو قورئان یان بەشێك لە قورئان بدات و کاتی بۆ تەرخان بکات و بیکاتە یەکێك لە ئامانجە گەورەکانی .

دوای ئەم هاندانە لەوانەیە بپرسیت باشە من دەمەوێت قورئان لەبەر بکەم بەڵام چۆن ؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پشتبەست بە خوای گەورە کۆمەڵە خاڵێکی پوخت و گرنگم بۆ نوسیویت هیوادارم ببێتە هۆکارێك بۆ گەیشتن بە ئامانجە گەورەکەت کە ( لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز)ە .

* * * * * *

# چۆنیەتی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز

چەندین خشتە و بەرنامە هەیە بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ، جیاوازی بەرنامەکانیش بۆ کەم و زۆری ئەو ڕێژەیە دەگەڕێتەوە کە کەسەکە لەبەری دەکات ، لەم نوسینەدا تەنها دوو بەرنامەم بۆ هەڵبژاردویت خوای گەورە یارمەتیت بدات بۆ جێبەجێکردنی ئەوەیان کە لەگەڵتدا دەگونجێت .

## أ. لەبەرکردنی نیو لا پەڕە ( حەوت دێڕ ) لە ڕۆژێکدا :

١. پێش ئەوەی دەست بە لەبەرکردنی ڕۆژانەت بکەیت جارێك یان چەند جارێك گوێ لە قورئانخوێنێکی شارەزا بگرە بۆ ئەو ئایەتانەی دەتەوێت لەو ڕۆژەدا لەبەری بکەیت ، لە باشترین قورئانخوێنەکانیش وەکو : ( محمود خليل الحصري ، المنشاوي ، الحذيفي ) .

٢ . هەوڵ بدە تەفسیری ئەو ئایەتانە بخوێنیتەوە کە دەتەوێت لەبەری بکەیت ، ئەمەش ناوی هەندێك لە تەفسیرە متمانەپێکراوەکانە :

تەفسیری کوردی : ( رێبەر ، تەفسیری میسر بە کوردی )

.

تەفسیری عەرەبی : ( المختصر في التفسير ، التفسير الميسر ، تيسير الكريم الرحمن لعبدالرحمن السعدي ) .

٣ . لە کاتی لەبەرکردندا بە جوانی سەیری ئایەتەکە بکە، بۆ ئەوەی وێنەکەی لە مێشکتدا جێگیر ببێت و بمێنێتەوە

.

٤ . ئایەت ئایەت دەست بکە بە لەبەرکردن بەڵام ئەو ئایەتانەی کە زۆر کورتن دەتوانیت دوو دوو یان سێ سێ یاخود دێڕ دێڕ لەبەریان بکەیت .

٥. یەکەم ئایەت سێ جار لەسەر قورئانەکە بە تەجویدەوە و بەهێواشی بخوێنەوە پاشان دەست بکە بە لەبەرکردنی ، ئەگەر لەبەرت کرد چەندین جار دوبارەی بکەرەوە تاوەکو بە جوانی لە مێشکتدا دەچەسپێت .

٦. ئایەتی دووەم بە هەمان شێوەی ئایەتی یەکەم لەبەر بکە و پاشان هەردوکیان پێکەوە دوبارە بکەرەوە ( لە پێنج جار کەمتر نەبێت و تا زیاتر بێت باشترە ) ، پاشان ئایەتەکانی تریش بەم شێوازە لەبەر بکە و هەر ئایەتێکت لەبەر کرد لەگەڵ پێش خۆیدا دوبارەی بکەرەوە بەو شێوازەی باسم کرد .

٧. پاشان کە نیو لاپەڕەکەت هەموی لەبەرکرد پێکەوە دە جار دوبارەی بکەرەوە بەڵام مەرج نیە هەر دە

جارەکە لە یەك کاتدا بێت ، دەتوانیت لەچەند کاتێکی جیاوازدا بێت بەڵام لە هەمان رۆژدا .

٨. بۆ رۆژی داهاتوو کە چویتە سەر نیو لاپەڕەی تازە نیوەکەی رۆژی پێشتر پێنج جار دوبارە بکەرەوە ئینجا دەست بکە بە لەبەرکردنی تازە .

٩. هەموو رۆژێك تا حیزبێك تەواو دەکەیت ( واتە : دە لاپەڕە ) ئەوەی لەو حیزبە لەبەرت کردوە یەك جار دوبارەی بکەرەوە .

١٠. کە لەبەرکردنی حیزبێکت تەواو کرد رۆژانە یەك جار تا ماوەی هەفتەیەك ئەو حیزبە دوبارە بکەرەوە و پاشان تاقیکردنەوەی تێدا ئەنجام بدە لای مامۆستاکەت ( ئەگەر مامۆستات هەبوو ) .

١١ . هەفتەی پێنج رۆژ لەبەر بکە ( لە شەممە تاوەکو چوار شەممە ) .

١٢ . لەسەر ئەم خشتەیە بە پێنج ساڵ هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەیت .

* * * * * *

## ب . لەبەرکردنی یەك لا پەڕە ( پانزە دێڕ ) لە ڕۆژێکدا :

١. ئەو لاپەڕەیەی دەتەوێت لەبەری بکەیت بیکە بە دوو بەشەوە بەشی یەکەمی بەو شێوازەی لەسەرەوە باسمانکرد لەبەر بکە و پێنج جار دوبارەی بکەرەوە ، پاشان نیوەی دووەمیش بەهەمان شێوە لەبەر بکە کە باسمان کرد و پێنج جار دوبارەی بکەرەوە، پاشان لاپەڕەکە هەموی پێکەوە دە جار دوبارە بکەرەوە .

٢. بۆ ڕۆژی داهاتوو کە چویتە سەر لاپەڕەی تازە لاپەڕەکەی ڕۆژی پێشتر پێنج جار دوبارە بکەرەوە ئینجا دەست بکە بە لەبەرکردنی تازە .

٣. هەموو ڕۆژێك تا جوزئێك تەواو دەکەیت ئەوەی لەو جوزئە لەبەرت کردوە یەك جار دوبارەی بکەرەوە .

٤. کە لەبەرکردنی جوزئێکت تەواو کرد رۆژانە یەك جار تا ماوەی هەفتەیەك ئەو جوزئە دوبارە بکەرەوە و پاشان تاقیکردنەوەی تێدا ئەنجام بدە لای مامۆستاکەت ( ئەگەر مامۆستات هەبوو ) .

٥ . هەفتەی پێنج رۆژ لەبەر بکە ( لە شەممە تاوەکو چوار شەممە ) .

٦ . لەسەر ئەم خشتەیە بە دوو ساڵ و شەش مانگ هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەیت .

* * * * * *

# چۆنیەتی دوبارەکردنەوەی قورئانی پیرۆز

خشتەی زۆر هەیە بۆ دوبارەکردنەوەی قورئان لێرەدا تەنها یەك خشتەم بۆ هەڵبژاردویت چونکە مامناوەندە و لەگەڵ زۆربەی کەسەکاندا دەگونجێت ، خوای گەورە یارمەتیت بدات بۆ بەردەوام بون لەسەری .

**تێبینی** : لەم خشتەیەدا لەبەرکراوەکەت بەسەر حەوت ڕۆژدا دابەش کراوە .

| ئەو ڕێژەیەی کە لەبەرت کردوە | ڕێژەی دوبارە کردنەوەی ڕۆژانە |
| --- | --- |
| 1 جوزء تا 3 جوزء و نیو | نیو جوزء (حزبێک) |
| 4 جوزء تا 7 جوزء | جوزئێک |
| 7 جوزء و نیو تا 11 جوزء | جوزء و نیوێک (30 لاپەڕە) |
| 11 جوزء و نیو تا 14 جوزء | دوو جوزء |
| 14 جوزء و نیو تا 17 جوزء | 2 جوزء و نیو |
| 17 جوزء و نیو تا 20 جوزء | 3 جوزء |
| 20 جوزء و نیو تا 23 جوزء و نیو | 3 جوزء و نیو |
| 24 جوزء تا 27 جوزء | 4 جوزء |
| 28 جوزء تا 30 جوزء | 4 جوزء و ڕوبعێک(85 لاپەڕە) |

## چەند خاڵێکی گرنگ لەسەر لەبەرکردن و دوبارەکردنەوە

١ . پێش لەبەر کردن دەستنوێژێکی جوان بگرە و بە جلێکی پاك و گونجاوەوە روو لە قیبلە بکە و دەست بکە بە لەبەرکردن .

٢ . رۆژانە دوعا بکە کە خوای گەورە یارمەتیت بدات و ئاسانکاریت بۆ بکات بۆ لەبەرکردنی قورئان و لێ تێگەیشتنی و کارپێکردنی و بەردەوامبون لەسەری .

٣ . هەر لەسەرەتای لەبەرکردنەوە بەروارێك دابنێ کە لەو رۆژەدا دەبیتە ( حافظی قورئان ) و دوعا بکە و بەردەوام لە خەیاڵتدا بێت کە پشتبەست بە خوا لەو رۆژەدا ئامانجە گەورەکەت بەدی دێت .

٤ . لەبەرکردن و دوبارەکردنەوە لە شوێنی بێدەنگ و داخراودا باشترە و تەرکیزت زیاترە .

٥. لە کاتی گونجاودا لەبەر بکە و لە کاتی خەوهاتنی زۆر یان ماندوییەکی زۆر یان زۆر بێتاقەتیدا لەبەر مەکە .

٦. باشترین کات بۆ لەبەرکردن پێش نوێژی بەیانیە ئەگەر پێت نەکرا دوای نوێژی بەیانی، ئەگەر هەر پێت نەکرا ئەوا لە هەر کاتێکدا لەبەر بکە کە بۆت دەگونجێ .

٧ . لە هەر ئاستێکی تەمەندا بیت ئاساییە دەست بە لەبەرکردنی قورئان بکەیت چونکە کەسی وا هەیە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەر کردوە کەسی واش هەیە لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لەبەری کردوە و خوێنەواریشی نەبوە هەر بە گوێگرتن لەبەری کردوە، گرنگ ئەوەیە نیەتێکی پاك و هەوڵێکی ڕاستگۆیانەت هەبێت .

٨ . لە کاتی لەبەرکردن و دوبارەکردنەوەدا با دەنگت نزم نەبێت هیچ نەبێت با ئەوەندە بەرز بێت کە خۆت بیبیستیت .

٩ . ئەگەر بەو ژمارە دوبارەکردنەوانەی بۆمان نوسیویت ( دە جار یان پانزە جار ) بۆت لەبەر نەکرا بە جوانی ئەوە هەوڵ بدە زیاتری بکەیت تا ئەوەندەی لە مێشکتدا دەچەسپێت چونکە ئێمە لە دانانی ئەو ژمارانەدا لانی کەممان وەرگرتوە بۆیە دەتوانی بە گوێرەی توانای خۆت زیادی بکەیت ، لە هەندێك لە وڵاتان ٨٠ جار و زۆر لەوە زیاتریش لاپەڕەیەك دوبارە دەکەنەوە .

١٠ . لە کاتی دوبارە کردنەوەدا سەیری قورئان مەکە مەگەر گومانت هەبێت کە هەڵەت کردبێت ئەو کاتەش بیر بکەرەوە ئەگەر بیرت نەکەوتەوە ئەوا سەیری قورئانەکە

بکە و چەند جارێك ئەو ئایەتە دوبارە بکەرەوە کە هەڵەکەت تێدا کردوە بۆ ئەوەی جارێکیتر لەو شوێنەدا هەڵە نەکەیت .

١١ . کاتی گونجاو بۆ دوبارەکردنەوەی جوزئێك بریتیە لە ( ٢٠ ) تاوەکو ( ٣٠ ) دەقیقە، ئەگەر لە سەرەتاوە کەمێك لەوە زیاتریش بێت ئاساییە .

١٢ . تاوەکو لەبەرکردنی ڕۆژانەکەت زیاتر دوبارە بکەیتەوە زیاتر دەچەسپێت، دوبارەکردنەوەش راهاتنە و چێژێکی تایبەتی هەیە خۆتی لێ بێبەش مەکە .

١٣ . با قورئانێکی تایبەت بە خۆتت هەبێت و هەرگیز مەیگۆڕە .

١٤ . لەبەرکردن و دوبارەکردنەوە لەسەر مۆبایل و ئایپاد هەڵەیەکی کوشندەیە .

١٥ . دەتوانیت هەر سورەتێك ژمارەی تایبەت بۆ لاپەڕەکانی دابنێیت بۆ نمونە : سورەتی ( الأنبياء ) دە لاپەڕەیە دەتوانیت لەسەرەوەی لاپەڕەکانی ژمارەی بۆ دابنێیت .

١٦. هەر حیزبێك یان جوزئێك تێیدا خراپ بویت یەك هەفتە هەمو ڕۆژێك یەك جار دوبارەی بکەرەوە باشتر دەبیت إن شاء الله .

١٧ . لە دوبارەکردنەوەدا با خوێندنەوەکەت مامناوەند بێت نە هێواش وە نە زۆر خێرا ، وریای خواردنی پیت یان حەرەکە بە .

١٨ . لە پاش لەبەرکردنی هەر لاپەڕەیەك بە مۆبایلەکەت دەنگی خۆت تۆمار بکە بۆ ئەوەی بزانیت هەڵەت کردوە یاخود نا .

١٩ . باشترین جۆری دوبارەكردنەوە ئەوەیە كە بۆ كەسێكی تر بیخوێنیت .

٢٠ . لەبەركردن لای مامۆستا چاكترینە ئەگەر نەكرا نائومێد مەبە پشت بە خوا ببەستە و خۆت دەست پێبكە.

٢١ . ئەگەر دوبارەكردنەوەی رۆژێكت فەوتا تا دەتوانی بۆ رۆژی دواتر قەرەبوی بكەرەوە .

٢٢ . ئەگەر لەبەركردنی رۆژێكت فەوتا بۆ رۆژی دواتر قەرەبوی مەكەرەوە بۆ ئەوەی قورس نەبێت لەسەرت .

٢٣ . ئەگەر رۆژانە نیو لاپەڕە كەمتر یان لاپەڕەیەك زیاترت لەبەركرد هەر بەو شێوازەی باسمانكرد لەبەر بكە

.

٢٤ . لە کاتی لەبەرکردندا هەر ئایەتێکی لێکچوو ( متشابە )ت بینی زەبتی بکە بەم شێوەیە :

بە جوانی سەیری ئایەتە لێکچوەکان بکە و جیاوازیەکانیان بزانە، پاشان چەند جارێك دوبارەیان بکەرەوە تاوەکو لە مێشکتدا دەچەسپێن .

٢٥ . ئەگەر بۆت گونجا کەسێکی بەڕەوشت و ورەبەرز بکە بە هاوڕێی خۆت کە پێکەوە لەبەر بکەن و دوبارە بکەنەوە .

٢٦ . ئەگەر پێت کرا هەموو قورئان لەبەر بکەیت ئەوا خێرێکی ئێجگار گەورەیە بەڵام ئەگەر پێت نەکرا دەتوانیت بە پێی توانای خۆت لەبەر بکەیت جوزئێك یان دوان یان پێنج یان زیاتر و بە جوانی زەبتی بکە .

٢٧. لە کۆنەوە زانایان فەرمویانە : ئەوەی لەبەرکراوەکەی لە ماوەی پێنج رۆژدا دوبارە بکاتەوە لە بیری ناچێتەوە ، بەڵام ئێمە لەم نوسراوەدا رەچاوی حاڵی زۆرینەمان کردوە .

٢٨ . سەرەتا و کۆتایی حیزب و جوزئەکان لە قورئانەکاندا دیاریکراوە بەڵام بۆ ئەو کەسەی کە نازانێت مەبەستمان لە حیزب : دە لاپەڕەیە، و مەبەستمان لە جوزء : بیست لاپەڕەیە .

* * * * **

# کۆتـایی

لەوانەیە بڵێیت ئەوەی بۆت نوسیوین قورسە و جێبەجێ کردنی ئەستەمە ، لەوەڵامدا دەڵێم :

بۆ ئەم وڵاتەی خۆمان کە ڕانەهاتوین لەسەر لەبەرکردنی قورئان بە بەرنامە هەندێك قورسە لە سەرەتاوە بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ڕادێیت و لەسەرت ئاسان دەبێت إن شاء الله ، پاشان لە یوتیوب سەیرێکی ئەزمونی وڵاتانی تر بکە ئەو کات ڕەخنەمان لێدەگریت کە ئاسانکاری و چاوپۆشی زۆرمان کردوە .

ئەم چەند لاپەڕەی بۆم نوسیویت بەرهەمی خەیاڵی خۆم نیە بەڵکو سەیری ئەزمونی زۆرێك لە وڵاتانی ترم کردوە و پوختەیەکم بۆ دارشتویت ، خوای گەورە لە منی وەربگرێت و تۆشی لێ سوودمەند بکات ، آمین .

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه وسلم .